الشيخ محمد بن صالح العثيمين

# هۆكارەكانی چوونە دۆزەخ






و . پشتیوان حسن

چاپی سێیەم

# هۆکارەکانی چوونە دۆزەخ

وەرگیراوە لە کتێبی ( مجالس شهر رمضان )


لە نوسینی

الشیخ محمد بن صالح العثیمین ( رحمه الله )

پوخت کردن و وەرگێڕانی

پشتیوان حسن



چاپی سێ یەم

١٤٣٤ کۆچی

بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوە
«سەنتەری کارزان» چەمچەماڵ ، پشت بازاڕی دۆلارەکە
٠٧٧٠٧٧٢٦١١٤

بنکەکانی بڵاوکردنەوە :

کتێبخانەی پێشین – هەولێر .
تۆمارگای شافعی – هەولێر .
کتێبخانەی صوهەیب – کۆیە .
کتێبخانەی سوننە : سلێمانی – شەقامی مەولەوی
کتێبخانەی ئیمان – سلێمانی – تەلای کەشتی نوح.
کتێبخانەی الأثر – سلێمانی – نزیک مزگەوتی دارۆغا .
کتێبخانەی سیما – چەمچەماڵ – پشت بازاڕی دۆلارەکە .
کتێبخانەی زانستی بەسوود – کەلار
کتێبخانەی کاروانی زانست – کفری

==========================

سەرپەرشتی چاپ : کتێبخانە و تۆمارگای بەهەشت
کەلار - نزیک فلکەی ناو بازاڕ – تەنیشت چێشتخانەی شێروانە

# سەنتەری ڕۆشنبیری کارا

سەنتەرێکی ڕۆشنبیری و بانگەوازی ئیسلامی و گشتی هەمە لایەنە ، نا حزبی و سەربەخۆیە ، هەوڵەکانی دەخاتە گەڕ بۆ سەرخستنی بەها بالآکان.

بۆ تێگەیاندنی ڕۆڵەکانی کوردستان و کورد زمان بە بیروباوەڕی ئیسلامی ڕەسەن بە پێی بەڵگە و تێگەیشتنی باشترین پێشینەکانی ئوممەتی ئیسلام .

دروست کردنی تاکی دڵسۆز و کارا بۆ خزمەتی ئیسلام و نیشتمان بۆ ئەوەی هۆکاری پێشکەوتنی وڵات و خەڵکی بن..

بەرنامەی پەرستن و کار و بانگەواز ، بۆ ئەوەی خەڵکی دڵسۆز بە بەرچاوڕوونی تێبکۆشن و هەنگاو هەڵنێن.

ڕێکردنەوەی تەوەری گفتوگۆ و لێك تێگەیشتن بێ کورت هەڵهاتن و توندبوون ، تەنها بەڵگە و تاوتوێ کردنی بۆچوونەکان و یەکلابوونەوەی وتەکان و بۆچوونەکان لە ڕوانگەی بەڵگەو بنچینەکانی ئیسلام .

هەنگاونان بەرە و کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی پەیوەست بە ئاینەکەیەوە ، فراوان لە کردار و گەورە لە بیرکردنەوە و جوان لە ڕەفتاردا.

ئامانجی هەموو کارەکانیشمان تەنها ڕەزامەندی خوای گەورەیە، وە پاشان خزمەت کردنی کۆمەڵگاکەمانە..

لە دوعای خێرتان بێ بەشمان مەکەن

# پێشەکی وەرگێڕ

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين وعلى آله وصحبه أجمعين. أما بعد:

خوێنەری بەڕێز : ئەم نامیلکەیەی بەردەستت لە سێ باسی سەرەکی پێکهاتووە :

**یەکەم** : کورتەیەکە سەبارەت بە وەصفی دۆزەخ و سزاو ناڕەحەتیەکانی لە ژێر تیشی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

**دووەم** : باس لەو هۆکارانە دەکات کە خاوەنەکەی یاخود بکەرەکەی لە بازنەی ئیمان دەباتە دەرەوەو بێباوەڕ دەبێت پێی، بەو هۆیەوە بەهەتاهەتایی لە ئاگردا دەمێنێتەوە.

**سێ یەم**: باس لەو هۆکارانە دەکات کە خاوەنەکەی پێی فاسق دەبێت (موسڵمانە چونکە باوەڕی هەیە بەڵام فاسقە لەبەر ئەوەی تاوانێکی گەورەی کردووە) شایەنی چوونە ناو دۆزەخ دەبێت بەڵام بەهەتا هەتایی نا.

خوای گەورە پەنامان بدات لە ئاگری دۆزەخ

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

وەرگێڕ

# باسی یەکەم

## کورتە باسێك سەبارەت بە وەصفی دۆزەخ و سزاو ناڕەحەتیەکانی

لە ژێر تیشی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

الحمد لله رب العالمين وصلى الله وسلم على نبينا محمد واله وصحبه والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين.... أما بعد:

خوای گەورە لە قورئاندا وریایی کردوینەتەوە لە ئاگر و هەواڵی پێداوین سەبارەت بە سزا جۆراو جۆرەکانی بەشێوەیەك کە جگەر و دڵەکان پارچە پارچە دەکات ، لە ئاگر وریایی کردوینەتەوە و هەواڵی پێداوین وەکو ڕەحمەتێك بۆمان بۆ ئەوەی زیاتر بترسین و وریابین ، بۆیە گوێبیستی ئەم دەقانە بن کە لە قورئان و سوننەتدا هاتوون سەبارەت بە جۆراو جۆری سزاکانی دۆزەخ بۆ ئەوەی بیربکەنەوە ، و بگەڕێنەوەو بۆلای خواوەندتان و ملکەچی فەرمانی ئەوبن [redacted] پێش ئەوەیسزاکەتان بۆ بێ دواییش ئیتر لەلایەن هیچ کەسێکەوە یارمەتی نادرێن.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَـــافِرِينَ﴾ [آل عمران: ١٣١]

واتە: خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە ئامادە کراوە بۆ کافرو بێ باوەڕان

هەروەها فەرموویەتی : ﴿إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلاسِلَ وَأَغْلالاً وَسَعِيراً ﴾ [الإنسان: ٤]،

واتە: بەڕاستی ئێمە کۆت و زنیجر - کە هەردوو قاچ و پێی ئەبەسترێتەوەو، هەردوو دەستیی بەگەردنیەوە پێ جەڕ دەدەرێ - لەگەڵ ئاگرێکی سوتێنەرو هەڵگیرساودا ئامادەمانکردووە بۆ بێ باوەڕەکان.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا﴾ [الكهف: ٢٩]،

واتە: بێگومان ئێمە ئاگرێکی گەرممان بۆ ناهەقکاران و ستەمکارانی کافران ئامادە کردووە کە لە هەموولایەکەوە دەوریان دەدات و دیواری بڵێسەی ئابڵوقەی داون،

هەروەها فەرموویەتی : ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ كَـــفَرُواْ إِلَى جَهَنَّمَ زُمَراً حَتَّى إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا﴾ [الزمر: ٧١]،

واتە: وە ئەوانەی باوەڕیان نەبووە دەستە دەستە بۆ دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن 'وەك چۆن لە دونیادا بۆ زیندان ئەنێررێن ، هەرکە نزیك

بوونەوە لە دۆزەخ، بێ ماتڵ بوون خێرا دەرگاکانیان بۆ ئەکرێتەوە.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿وَلِلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ * إِذَا أُلْقُوا فِيهَا سَمِعُوا لَهَا شَهِيقًا وَهِيَ تَفُورُ* تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الغَيْظِ﴾ [الملك: ٦ ٨]،

واتە: بۆ ئەوانەش بە پەروەردگاریان کافر و بێباوەڕ بوون، سزای دۆزەخ هەیە کەجێگایەکی زۆر خراپە دۆزەخ * کاتێك کە فڕێ درانە ناوی یەوە لەو دۆزەخەوە لوورەو نرکەیەك دەبیستن وە ئەو ئەکوڵێ و جۆش دەخوات* لەداخی کافراندا خەریکە لەت لەت بیێ و، لەیەك بێتەوە.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿لَهُمْ مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ النَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ذَلِكَ يُخَوِّفُ اللَّهُ بِهِ عِبَادَهُ يعِبَادِ فَاتَّقُونِ﴾[الزمر: ١٦]

واتە: ئەوانە لە سەرویانەوە پەڵە هەوری دووکەڵ لە ئاگری دەوری داون، لە ژێریشیانەوە هەمان پەڵە هەور و دووکەڵ هەیە،!! خوا بەو وێناکردنە بۆ ئاگر، بەندەکانی بەوە ئەترسێنێ و هۆشیاریان

ئەکاتەوە ،دەسا ئەی بەندەکانم! لەنافەرمانی من پارێز بکەن، شتێ مەکەن ببێتە مایەی سزادانتان.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿ وَأَصْحَـابُ الشِّمَالِ مَآ أَصْحَـابُ الشِّمَالِ * فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ * وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ * لاَّ بَارِدٍ وَلاَ كَرِيمٍ ﴾ [الواقعة: ٤١-٤٤]

واتە: یارانی لای چەپ، چین یارانی لای چەپ؟ مەگەر خوا بزانێ حاڵیان چەند بەد حالە؟! ئەو کەسانەن کەنامەی کارەکانیان بەدەستی چەپیانەوە دەدرێت * لەناو گەرمای ئاگرێکی دۆزەخ و ئاوێکی کوڵ بەکوڵدان * لەژێر سێبەری چڕە دووکەڵێکی زۆر ڕەشدان * نەسێبەرێکی فێنکە لە گەرما کەم بکاتەوە، وەنەدیمەنێکی جوانیشی هەیە .

هەروەها فەرموویەتی : ﴿إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ * يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴾ [القمر: ٤٧، ٤٨]

واتە: بێگومان تاوانکارەکان لەسەر گەردانییەکی دوور لە هەق و لە ئاگرێکی هەڵگیرساودان * ئەو رۆژە کەلەسەر ڕوویان بەناو

ئاگردا رائەكێشرێن ، پێیان ئەوترێ: دەبچێژن گەرماو سزای دۆزەخ ، لەپاداشتی كارەكانتاندا، دەبزانم كەسێك هەیە قوتارتان بكات.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿وَمَآ أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ * لاَ تُبْقِي وَلاَ تَذَرُ * لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴾ [المدثر: ٢٧-٢٩]

راتە: جا تۆ چوزانی (سەقەر) چییە..؟ ئەگەر پێت نەڵێم * ئاگرێكە هیچ شتێك نایەڵێتەوە ئەیسووتێنێ لە گۆشت و ئێسقان و دەمارو وازیش ناهێنێت وجێناهێڵێت * پێستی سەرەوە و لاشە رەش ئەكاتەوە، واتە: بەهەرچی بگات ئەیسوتێنێ

هەروەها فەرموویەتی : ﴿يَأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُواْ قُواْ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلاَئِكَةٌ غِلاَظٌ شِدَادٌ لاَّ يَعْصُونَ اللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾[التحريم: ٦]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! خۆتان و ژن وماڵ و كەس و كارەكەتان بپارێزن لەئاگرێك كە سووتەمەنیەكەی جەستەو لاشەی مرۆی كافرو بەردی گۆگردە، [مەبەست ئەوەیە كە زۆر بڵێسەدارو بەگڕو گەرمە، وەك ئاگری ئەم دنیا نیە كە تەنها

بەداروبە چیلکە هەڵگیرسێ، بەڵکو ئەو بە بەرد زیاتر گڕدەگرێ و بڵێسە ئەسێنێ] کۆمەڵە فریشتەیەکی زبرو توندو تیژ بەسەریەوەن، هەر چەندە داوای بەزەییان لێبکرێ کەڵکی نیە ، نافەرمانی خوا ناکەن لە هەرشتێك فرمانیان پێبکا وهەر فرمانێکیشیان پێ بسپێرێ، بە خێرایی ئەنجامی دەدەن.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿فَالَّذِينَ كَفَرُواْ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ * يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ * وَلَهُمْ مَّقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ * كُلَّمَآ أَرَادُواْ أَن يَخْرُجُواْ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا وَذُوقُواْ عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾[الحج: ١٩- ٢٢]

واتە: ئەوانەی کافرو بێبڕوابوون، جل و بەرگ و پۆشاکی ئاگریان بۆبڕاوە، بەئەندازەی قەدو باڵای خۆیان ئاوی کوڵ بەکوڵیشیان لەسەروەوە بەسەرا دەکرێ *هەر بەو ئاوە ناوسکیان و پێستیان ئەتوێنرێتەوەو دەبێتە ئاو و دێتە خوارەوە، پێستەکەشیان هەموو لەتاو گەرمای ئەو ئاوەدا دەبلۆخێ * بەرگورزی ئاسنیش دەدرێن * هەر کاتێکیش گەرەکیان بێ کە لێی دەرچن لە خەم و خەفەتاندا ئەگەڕێنرێنەوە بۆ ناویی و قەتیش ڕزگاریان نابێ ،

بۆ ئەوەی زیاتریش ئێشیان پێ بگات، پێیان ئەوترێ: دەی سزای سووتێنەر بچێژن، ئەمە پاداشت و تۆڵەی بێ بڕوایان بوو.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَاراً كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُوداً غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ الْعَذَابَ ﴾ [النساء: ١٥]

واتە: بێگومان ئەو کەسانەی بەئایەت و نیشانەکانی ئێمە بێ باوەڕن لەدوارۆژدا دەیانبەینە ناو ئاگرێکی بڵێسەدارو گەرمەوە ئەیانبرژێنێ هەرجارەی کەپێستی جەستەیان داپلۆخاو سووتا چەند پێستێکی تریان بۆئەگۆڕین لەجێی ئەودا تاپتر ئەوسزایە بچێژن.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿إِنَّ شَجَرَةَ الزَّقُّومِ * طَعَامُ الأَثِيمِ * كَالْمُهْلِ يَغْلِي فِي الْبُطُونِ * كَغَلْيِ الْحَمِيمِ ﴾ [الدخان: ٤٣-٤٦]

واتە: بەڕاستی درەختی ژەقنەبووت (درەختێکە لە ناخی دۆزەخدا، لەناو ئاگردا، خوای بەدەسەڵات ڕواندوویەتی و لق و پەلکەکانی بە ناویدا بڵاو بۆتەوە)* خۆراکی تاوانکارە، واتە:مرۆڤی کافرە* هەر وەك مسی تواوە لەسکی گوناهباراندا

جۆش ئەخواو ئەکوڵێ ❊ هەرچۆنێ ئاوی کوڵ بەکوڵ دێتە جۆش، هەرکات دۆزەخیەکان برسییان بوو، بەری ئەو درەختەیان ئەدرێتی و، لەسکیاندا وەك ئاوی گەرم ئەکوڵێ .

هەروەها فەرموویەتی : ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ * لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ * فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ * فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ * فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ * هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ﴾ [الواقعة: ٥١-٥٦]

واتە: پاشان ئێوە ئەی لارێ و گومڕاو کافرو نکوڵی کەران! ❊ بێگومان لەبەروبوومی (زەققوم) -درەختێکە لەناوەڕاستی دۆزەخدا- ئەخۆن ❊ لەبەر زۆر برسێتی، ورگ و زکتانی لێ پڕئەکەن گوێ بەتام و چێژی زۆر ناخۆشیشی نادەن ❊ ئەوسا لەبەر تینویەتی لە ئاوێکی زۆر گەرم بە کوڵیشی بەسەرا دەکەن ❊ جا ئێوەش هەروەکو وشتری تینوو کە دەردی (هویام)ـی گرتبێ و هیچ کات تێر ئاونەبێ دەخۆنەوەو تێر ئاویش نابن ❊ ئەمەیە خۆراك و ئاوو میوانداری خوانەناسان لەرۆژی پاداشت.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿وَيُسْقَى مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ * يَتَجَرَّعُهُ وَلاَ يَكَادُ يُسِيغُهُ وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ وَمِن وَرَآئِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾ [إبراهيم: ١٦، ١٧]

واتە: تیایدا کێم و زووخاوی دەرخوارد دەدرێت * لەبەر تاڵیی و ناخۆشییەکەی، زۆر بەقێزوو بێزەوە قوم قوم دەیخواتەوە ، و بەئاسانیش بۆی قووت ناچێ .لە هەموولایەکیشەوە مەرگی بۆ دێت کەچی ناشمرێ تا لەو سزایە رزگاری ببێ ، و پاش ئەو هەموو تاڵیی و تفتییەش، سزاو جەزرەبەیەکی زۆر بەژانیش بەدوایەوە دێت.

ئایاتەکانی قورئان دەربارەی وەسفی ئاگر و سزا جۆراو جۆرە بە ئێشە بەردەوامەکانی زۆرە.

**وە فەرموودەکان دەربارەی ئاگری دۆزەخ:**

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): (يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَامٍ، مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا). رواه مسلم

واتە: (عبدالله) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (دۆزەخ دەهێنرێت حەفتا هەزار جڵەوی هەیە، لەگەڵ هەرجڵەوێکدا حەفتا هەزار فریشتە هەن ڕایدەکێشن).

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: (نَارُكُمْ هَذِهِ الَّتِي يُوقِدُ ابْنُ آدَمَ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ حَرِّ جَهَنَّمَ). قَالُوا: وَاللَّهِ إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: (فَإِنَّهَا فُضِّلَتْ عَلَيْهَا بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا، كُلُّهَا مِثْلُ حَرِّهَا). [بخاري / بدء الخلق/ ٣٠٩٢]

واتە: (أبی هریرە)(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەم ئاگرەی کە ئادەمیزاد بۆ سوتاندن بەکاری دەهێنن بەشێکە لە

حەفتا بەشی گەرمی دۆزەخ) وتیان: ئەگەر هەر ئەمەیش بوا بەسبوو ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش فەرمووی: (لە ڕاستید دۆزەخ شەست و نۆپلەی زیاترە لەو، هەر بەشێکی بەوێنەی ئە گەرمە).

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذْ سَمِعَ وَجْبَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله علي وسلم): (أتدْرُونَ مَا هَذَا). قَالَ: قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ (هَذَا حَجَرٌ رُمِيَ بِهِ فِي النَّارِ مُنْذُ سَبْعِينَ خَرِيفًا، فَهُوَ يَهْوِي فِ النَّارِ الْآنَ، حَتَّى انْتَهَى إِلَى قعرها). رواه مسلم

واتە: (أبی هریرە)(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت لەکاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم بووین گوێی لە گرمەیەك بوو، پێغەمبەریش (صلى الله علي وسلم) فەرمووی: (دەزانن ئەوە چی بوو) وتمان: خوا پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: (ئەوە بەردێك بوو فڕێدراب ناو دۆزەخەوە، حەفتا پایزە ڕۆدەچێت ئێستا دای لە بنەکەی).

وعَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): (إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا مَنْ لَهُ نَعْلَانِ وَشِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ، يَغْلِيَ مِنْهُمَا دِمَاغُهُ كَمَا يَغْلِ الْمِرْجَلُ، مَا يَرَى أَنَّ أَحَدًا أَشَدُّ مِنْهُ عَذَابًا، وَإِنَّهُ لَأَهْوَنُهُمْ عَذَابًا)رواه مسلم وللبخاريّ نحوه.

واته: (نعمان)ی كوڕی (بشير) (خوای لیّ ڕازی بیّت) دەفەرمویّت: پیّغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (سووكترین سزای ئەهلی دۆزەخ سزای كەسیّكە كە جووتیّ نەعلی ئاگرینی لەپیّدایە، میّشكی سەری پیّیانەوە دەكوڵیّ وەك چۆن مەنجەڵی ئاو دەكوڵیّ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا وانابینیّت كەكەس لەو سزای سەختتر بیّت، كەچی ئەو لەهەموویان سزای سووكترە).

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): (يُؤْتَى بِأَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُصْبَغُ فِي النَّارِ صَبْغَةً ثُمَّ يُقَالُ: يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ خَيْرًا قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ نَعِيمٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لَا وَاللَّهِ يَا رَبِّ. وَيُؤْتَى بِأَشَدِّ النَّاسِ بُؤْسًا فِي الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيُصْبَغُ صَبْغَةً فِي

الْجَنَّةِ، فَيُقَالُ لَهُ: يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ بُؤْسًا قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ شِدَّةٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لَا وَاللَّهِ يَا رَبِّ، مَا مَرَّ بِي بُؤْسٌ قَطُّ، وَلَا رَأَيْتُ شِدَّةً قَطُّ). رواه مسلم.

واتە: (أنس)ی کوڕی (مالك) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بەختەوەرترینی کەس لە دۆزەخیەکان لە ڕۆژی قیامەتدا دەهێنرێت، یەکجار هەڵدەژەنرێت لە ئاگر پاشان پێی دەوترێت: ئەی نەوەی ئادەم ئایا هەرگیز خێر و خۆشیت دیووە، ئایا هەرگیز نیعمەتی خوا بەسەرتا تێپەڕبووە؟ ئەویش دەڵێت: نەبەخوا ئەی پەروەدگار، ئینجا خێر لە خۆنەدیوترین کەسیش لە دونیادا لەبەهەشتیەکان دەهێنرێت یەکجار لە بەهەشتا هەڵدەژەنرێت پاشان پێی دەوترێت: ئەی نەوەی ئادەم ئایا هەرگیز ناخۆشیت بەخۆتەوە بینیوە، ئایا هەرگیز سەختیی بەسەرتا تێپەڕیووە، ئەویش دەڵێت: نەبەخوا ئەی پەروەردگار، هەرگیز ناخۆشیم لە ژیاندا نەدیوە، هەرگیز سەختیم نەدیوە).

واتە : خەڵکی دۆزەخ هەموو ئەو چێژو خۆشیانەیان لە بیر دەچێت کە لە ژیانی دونیادا بینیویانە ، وە خەڵکی بەهەشت هەموو ئەو شتە ناخۆشیانەیان بیر دەچێت کە لە ژیانی دونیادا توشیان بووە.

اللَّهُمَّ نَجِّنا من النار، وأعِذْنا من دارِ الخزْيِ والْبَوَار، وأسكنَّا برحمتِك دارَ المتقينَ الأبرار، واغفرْ لنا ولوالِدِينا ولجميع المسلمين، برحمتك يا أرحمَ الراحمين، وصلَّى الله وسلَّم على نبينا محمداً وعلى آله وصحبه أجمعين.

# باسی دووەم

# هۆکارەکانی چوونە دۆزەخ

أ- ئەو هۆکارانەی کە خاوەنەکەی یاخود بکەرەکەی لە بازنەی ئیمان دەباتە دەرەوەو بێباوەڕ دەبێت پێی، بەو هۆیەوە بەهەتاهەتایی لە ئاگردا دەمێنێتەوە.

الحمد لله رب العالمين وصلى الله وسلم على نبينا محمد واله وصحبه والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين.... أما بعد:

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەبەهێزو دەسەلاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا وتوانایی ودەسەلاتیشی ڕوون ودیارە لەهەموو شتێکدا، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە نـکەرنالەی نەخۆشیشی لێ ون نابێت ودەیبیسێ، جوولەجۆولی مندالی ناوسکی دایکی لێ ون نابێ ودەیبیـنێ، دەسەلاتدارە زلهێزەکان لەهەمبەر ئەودا زەلیل وبێ دەسەلاتن، هەرچۆنی ویـست بەو شێوەیە بڕیاردەدات بەسەر تاوانبارو هەلەکاراندا، هەلبژاردنیش هەر بەدەست ئەوە بۆدیاریکردنی هەلبژێرراوانی لە پێغەمبەران(دروودی خوایان لێ بێت)، وە بڕیاری کۆتایی لەنێوان بەندەکانی لە ڕۆژی دوایی هەر لای ئەوە کەبە گوێرەی کردەوەکانیان پاداشتیان دەداتەوە، ئەوانە کەسانی لای ڕاستـن وئەوانەش کەسانی لای چەپ ودۆزەخین، ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا وَلَكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي لأَمْلأَنَّ جَهَنَّمَ مِنْ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾[السجدة:١٣] واتە: ئەگەر ویستبامان هەموو

کەسێك بەزۆر بهێنینە سەر ڕێی هیدایەت ئەوا هەمو
کەسێکمان بەزۆر دەهێنایە سەر ڕێی ڕاست وهیدایەتمان دەدا
ئەگەر بمانویستایە تاوامان دەکرد بەڵام گفتەکە لەمنەو
جێگیربووە کە دەبێ دۆزەخ پڕبکەم لە جنی وئادەمی .

ئەمەش ئەی خوێنەری بەڕێز حیکمەت وکاردروستی
خوای داناو زانایە لەنێو بەندەکانیدا، شوکرو سوپاس
وستایشی دەکەم بەگوێرەی دروستکراوەکانی، وە داوای
کۆمەکی وهاوکاری لێ دەکەم وەکو ئارامگرو خۆڕاگران، و
پەنای پێدەگرم لەسزای دۆزەخ وتاڵی وناسۆری تۆڵەو سزای، و
شاهێدی دەدەم کە هیچ خوایەك شایستەی پەرستن نیە جگە
لە الله نەبێت، هەر ئەو پاشای حەق وڕاست وئاشکرایە، و
شاهێدی دەدەم کە محمد نێردراوی ڕاست ودروستی ئەوە بۆ
هەمور جیهانی ناردووە، سەلات وسەلامی خوا لەسەر ئەو
چوار هاوەڵە جێنشینەکانی و هەموو ئالوبەیت و هاوەڵ و
دەستەبرادارەکانی بێت، وە لەسەر هەموو شوێنکەوتووانی تا
ڕۆژی دوایی.

**خوێنەرانی یەکخواپەرست:** بزانن کە چوونە دۆزەخ- خواپەنامان بدات- چەند هۆکارو پاڵنەرێکی هەن کە خوای میهرەبان لە کتێبە پیرۆزەکەیدا ڕوونی کردۆتەوەو لەسەر زمانی شیرین گۆی پێغەمبەرەکەیشی ئاماژەی پێداوە، بۆ ئەوەی خەڵکی لێی ووریابن وخۆیانی لیٚ بەدووربگرن: وە ئەم هۆکارانەش دوو جۆرن:

**جۆری یەکەم:** هۆکارگەلێك کە خاوەنەکەی یاخود بکەرەکەی لە بازنەی ئیمان دەباتە دەرەوەو بێباوەڕدەبێت پێی، بەو هۆیەوە بەهەتاهەتایی لە ئاگردا دەمێنێتەوە.

**جۆری دووەم:** هۆکارگەلێك کە خاوەنەکەی پێی فاسق دەبێت (موسڵمانە چونکە باوەڕی هەیە بەڵام فاسقە لەبەر ئەوەی تاوانێکی گەورەی کردووە) شایەنی چوونە ناو دۆزەخ دەبێت بەڵام بەهەتاهەتایی نا.

**<u>ئێستا دێینە سەر جۆری یەکەم و باسیان دەکەین:</u>**

## * هۆكاری یەكەم: هاوبەش دانان بۆ خوا:

ئەوەش بریتیە لەهاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا لە پەروەردگاریێتم (باوەڕت وەها بێت كەیەكێكی تر هەیە جگە لەخوا یان لەگە خوادا بەشدارە لەدروست كردن وبەڕێوەبردنی جیهاندا) یا خوایەتی(واتە پەرستــن و هاوارپێكردن وجۆرەكانی تر بۆجگ لەخوا بكەیت) یان ناووسیفەتە جوان وبەرزەكانی، بەشێوەیە‌ا كە بەندە بڕوای وابێت خوایەكی ترهەیە كەبەهێزودەسەڵاتدار خاوەن بڕیارو زانستی ڕەهایە وەكو خوا، ئەوە هاوبەشم هەرەگەورەی بۆ خوا بڕیارداوە بەشێوەیەك كە شایەنی مانەوە: هەیە لەناوئاگری دۆزەخدا بەهەتاهەتایی، خوای گەو دەفەرمویت﴿ إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾{المائدة: ٧٢} واتە: چا بزانن كەهەركەس هاوبەش بۆخوا بڕیاربدات ئەوا بێشك خ بەهەشتی لەسەر حەرام دەكات وجێ وشوێنی ئاگ ستەمكارانیش هیچ جۆرە یارمەتیدەرێكیان بۆنیەو ڕزگار نابن

*** هۆكاری دووەم: بێباوەڕبوون بەخوا یان بەفریشتەیەك یان بەكتێبێكی ئاسمانی یان بەڕۆژی دوایی یاخود بەقەزاوقەدەر**

هەركەسێك مل پێچی بكات لەیەكێك لەوانە واتە بەدرۆیان بزانێت یان دانی پێدانەنێت یان گومانی هەبێت، ئەوە بێباوەڕە و شایەنی مانەوەی هەتاهەتاییە لەئاگردا، خوای گەورە دەفەرموێت﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً (١٥٠) أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقّاً وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَاباً مُهِيناً﴾{النساء:١٥٠-١٥١} واتە: ئەوانەی كە بێباوەڕن بەخواوپێغەمبەرەكانی و دەشیانەوێ لەنێوان خواوپێغەمبەرەكانیدا فەرق وجیاوازی دانێن دەڵێن: ئێمە باوەڕ بەهەندێكیان دەكەین وهەندێكیشیان بەجێی باوەڕ نازانین ودەشیانەوێ لەو نێوەندەدا ڕێگەیەك بۆخۆیان دیاری بكەن، بێ دوودڵی ئەوانە كافروخوانەناسن وەئێمە سزایەكی ئابڕووبەرمان بۆ ئەو كافروخوانەناسانە ئامادەكردووە.

هەروەها دەفەرمویێت : ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَعَنَ الْكَافِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيراً (٦٤) خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً لا يَجِدُونَ وَلِيّاً وَلا نَصِيراً (٦٥) يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَ (٦٦) وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَ (٦٧) رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنْ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْناً كَبِيراً﴾ {الاحزاب:٦٤-٦٨}

واتە: بەڕاستی خوا نەفرینی لە بێبڕواکان کردووە ولەڕەحمەتی خۆی دووری خستوونەتەوە ئاگرێکی هەڵگیرساوی زۆر سوتێنەریشی بۆئامادەکردوون، کەبەهەتا هەتایی دەبێ لەوێدا بمێننەوە دیارە لەوێش هیچ دۆست ویارمەتیدەرێکیان دەست ناکەوێ بەتایبەتی لەڕۆژێکدا کە دەم وچاویان لەناو ئاگری دۆزەخدا ئەم دیووئەودیوی پێ دەکرێ تاچاك ببرژێ ودەڵێن: بریا بەفەرمانی خوامان کردبا و گوێڕایەڵی پێغەمبەریش باین، وەئەڵێن: پەروەردگارا! بێگومان ئێمە فەرمانبەرداری سەرداروئاغاوگەورەکانمان بووین وگوێڕایەڵی ئەوانمان کرد وئەوانیش ڕێیان لێ هەڵەکردین وچەواشەیان کردین، پەروەردگاری ئێمە! دوو هێندە سزایان بدە ونەفرینێکی زۆریان لێبکەو لەمیهرەبانی خۆت زۆر دووریان بخەرەوە.

## * هۆکاری سێیەم: دان پێدانەنان یاخود ملپێـچی کردن لەیەکێك لە پـێنج پایەکەی ئیسلام

جاهەرکەسێك ئینکاری واجبێتی یەکخواپەرستی بکات یان شاهێدی دان بەپەیامی پێغەمبەرەکەی یان بڵێت ئەم دینە بۆهەموو جیهان نەنێردراوە یان ئینکاری واجبێتی نوێژ یان زەکات یان ڕۆژوو یان حەج بکات، ئەوە بێباوەڕە چونکە بەدرۆخەرەوەی خواوپێغەمبەرو یەکدەنگی زانایانە، بەهەمان شێوە ئەگەر کەسێك ئینکاری ئەوە بکات کە شیرك یان کوشتنی کەسێك خوا حەرامی کردبێ یان زیناوداوێن پیسی یان مەی خواردنەوە یان هەرشتێکی تر کەبەئاشکرا دەقی لەسەر هاتبێ لەقورئان وفەرموودەی ڕاست کە حەرام وناڕەوایە، ئەوا بێباوەڕە چونکە بەدرۆخەرەوەی خواوپێغەمبەرە، بەڵام ئەگەر کەسێك تازە بوبێتە موسڵمان وبەنەزانینەوە ئەم شتانە بڵێت ئەوا بێباوەڕنابێت پێی هەتا فێردەکرێت پاشان نکـۆڵی لێدەکرێت.

## * هۆکاری چوارەم: گاڵتەکردن وسووکایەتی بەخواو دینەکەی یان پێغەمبەرەکەی:

خوای گەورە دەفەرمویّت﴿ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ (٦٥) لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمانكم ﴾{التوبة:٦٥-٦٦} واتە: ئەگەر لێیان بپرسیت: سەبارەت بە گاڵتەکردن بەخواوئایەتەکانی وپێغەمبەرەکەی ئەڵێن: بەڕاستمان نەبووە بەڵکو تەنها گاڵتەوگەپمان دەکرد تۆش پێیان بڵێ: ئایا گاڵتەتان بەخواو ئایەتەکانی وبە پێغەمبەرەکەی کردبوو؟ بڵێ: بڕووبیانووی بێ جێ مەهێننەوە چونکە پاش ئەوەی کەباوەڕتان هێنا کافربوونەوە.

گاڵتەکردن وسوکایەتی وبەسووك سەیرکردنی خواو پێغەمبەرەکەی ودینەکەی لەگەورەترین تاوان وسەرپێچیەکانە، پاك وبێگەردی بۆ خوا.

## * هۆكاری پێـنجەم: جنـێودان بەخواو دینەكەی یان پێغەمبەرەكەی:

ئەوەش بریتیە لە توانج لێدان وكەم وكورتی دروستكردن بۆ دین و نەفرەت كردن وبێزلێهاتنەوە لەبەرنامەكەی خوا.

شیخ الاسـلام ابـن تیمیـە (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) دەڵێـت: هەركەسێك جنێو بە خوا یان بە پێغەمبەرەكـەی بـدات ئـەوا بێباوەڕدەبێت هەرچەندە بـشزانێت كەئـەو كـارە حەرامـە یـان بەحەلاڵی بزانێـت، هاوەڵانمـان (حەنبـەلی مەزهـەب) دەڵـێن: ئەوەی جنێو بەخوا بدات بێباوەڕدەبێت بابەگاڵتەشـەوە بیلێـت، ئەمەش ڕای پەسەندی گومانبـڕە.

ره گێڕراوەتەوە لە ئیـسحاقی كـوڕی ڕاهەوەیـەوە كـە زانایـان یەكدەنگن لەسەر ئەوەی كـە هەركەسـێك جنێـو بـەخوا یـان پێغەمبەر بدات یان بەشێك لە دینەكەی ڕەدبكاتەوە هەرچەندە دانیشی پێدابنێت ئەوا بێبڕوا دەبێـت ولـەدین دەچـێتە دەرەوە، ئـیبن تەیـمیە دیـسان دەڵێـت: حـوكمی جنێـودان بەهـەر پێغەمبـەرێك لەپێغەمبـەران (علـیهم الـسلام) كـەناویان

لەقورئان یان فەرموودەدا هاتووە بەوەی كە ئەو كەسە پێغەمبەرە وەكو جنێودانە بە پێغەمبەر محمد(صلی اللە علیە وسلم) وحوكمەكەیشی بێباوەڕبوونە وەكو پێشتر ئاماژەی بۆكرا.

بەڵام جنێودان بەكەسانی تری جگە لەپێغەمبەران وەكو هاوەڵان، ئەگەر مەبەست پێی جنێودان بێ بەخودی پێغەمبەر لەو ڕێگەیەوە چونكە هەركەسێك بەهاوەڵەكەی بەراورد دەكرێت ودەناسرێت، وەیاخود قسەوتن و بوهتان كردن بە یەكێك لەخێزانەكانی پێغەمبەر(صلی اللە علیە وسلم) بە زیناداوێن پیسی دیسان بێباوەڕدەبێ پێی چونكە ئەوە تانەدانە لە خودی پێغەمبەر(صلی اللە علیە وسلم)، وە خوای گەورە دەفەرموێت﴿الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ﴾{النور:٢٦}.

واتە: ژنانی پیس وناپاك بۆ پیاوانی پیس وناپاكن.

*** هۆكاری شەشەم: كاركردن وحوكم كردن بەجگەلە قورئان وبەرنامەی خوا وبڕوای وابێت كە ئەو یاساو دەستورە دانراوە لەحەقەوە نزیكترە وگونجاوترە بۆ خەڵك، یان وەكو بەرنامەودینی خوا وایەویەكسانە یاخود بڵێت دروستە ئیش بەمەش بكرێت لەگەڵ قورئاندا:**

جا هەركەس بیروباوەڕی وابێت وحوكم بەجگە لە ئاینی خوا بكات ئەوا بێباوەڕە، بەبەڵگەی ئەم ئایەتە كە خوای گەورە دەفەرموێت﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنـزَلَ اللَّـهُ فَأُوْلَئِـكَ هُـمُ الْكَافِرُونَ﴾{المائدة: ٤٤}واتە: هەركەسێ بەو كتێب وبەرنامە كە خوا ناردوویەتی حوكم وبڕیارنەدات، ئیتر لەبەر ئەوە بێ كەبەكەم وكورتی بزانێ، یان هەربڕوای پێی نەبێ، وەیان لەبەر هەر هۆیەكی تربێت، ئەوا كافروبێباوەڕە ولەدینی خوا دەچێتە دەرەوە.

بەهەمان شێوە ئەگەر كەسێك بڕوای وابێت كە كاركردن وپەیڕەوی كردن لە بەرنامەی تر باشترە لەبەرنامەی خوا یاخود وەكو ئەو وایەو دروستە كاری پێبكرێت، ئەوا بێباوەڕە

هەرچەندە كار بەبەرنامەكەش نەكات، چونكە ئەوكەسـە ئـە ئایەتەی خوا بەدرۆ دەخاتەوە كە دەفـەرموێت﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُوقِنُـونَ﴾{المائدة: ٥٠}واتـە: جـا دەبـێ بڕیـار حوكمی كێ باشتروجوانتربێ لەحوكم وفەرمانی خوا بۆ ئەوانەی كە هیچ شك وگومانێكیان نیەو ئـەهلی یـەقینن. وە هـەروەها ئایەتی﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُـمْ بِمَـا أَنـزَلَ اللَّـهُ فَأُوْلَئِـكَ هُـمْ الْكَافِرُونَ﴾{المائدة: ٤٤}.



*** هۆکاری حەوتەم: دوڕوویی :**

کەئەوەش بریتیە لەوەی کەسێك بەدڵ بێبڕوا بێت بەلاّم بە ڕواڵەت وا خۆی دەرخات کە موسڵمانە یان بەکردەوە یان بە گوفتاری، خوای گەورە دەفەرموێت﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيراً﴾{النساء:١٤٥}واتە: بەڕاستی دوڕووەکان لەچینی هەرە خوارەوەی ئاگری دۆزەخدان تۆش هەرگیز ناتوانیت هیچ یارمەتیدەرێکیان بۆ پەیدابکەی.

وە ئەم گروپ وکۆمەڵەیە تاوان وسەرپێچیەکەیان لەوەی پێشتر گەورەترە، هەربۆیە سزاو نارەحەتیەکەیان سەختترو بەئازارترە، لە چینی ژێرەوەی ئاگردان ئەوەش لەبەر ئەوەی جۆری بێباوەڕیەکەیان کۆکەرەوەیە لەنێوان بێباوەڕی فریودان وگاڵتەکردن بەخواو بەئایەتەکانی وپێغەمبەرەکەی، خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت :

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ (٨) يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ (٩) فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمْ اللَّهُ مَرَضاً وَلَهُمْ عَذَابٌ

أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ (١٠) وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لا تُفْسِدُوا فِي
الأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ (١١) أَلا إِنَّهُمْ هُمْ
الْمُفْسِدُونَ وَلَكِنْ لا يَشْعُرُونَ (١٢) وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا كَمَا
آمَنَ النَّاسُ قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ أَلا إِنَّهُمْ هُمْ السُّفَهَاءُ
وَلَكِنْ لا يَعْلَمُونَ (١٣) وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا
خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ (١٤)
اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ {البقرة:٨-١٥}.

واتە: لەو خەڵكانەدا كەسانێك هەن دەڵێن: باوەڕمان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە كەچی درۆ دەكەن وبڕوایان نیە، بەڵكو دەیانەوێ ئێوە فریوبدەن ووردە وردە لێتان نزیك ببنەوە ولەدژتان پیلان بگێڕن وپشێوی بخەنە ناوتانەوە وریزەكانتان تێك بدەن* ئەوانە بەنیازی خۆیان دەیانەوێ فێڵ وتەڵەكە لەگەڵ خواداو ئەو كەسانەدا بكەن كەبڕوایان هێناوە بەڵام لەڕاستیدا تەنها لەگەڵ خۆیاندا فێڵ دەكەن وخۆیان دەخەڵەتێنن لەحاڵێكدا هەستیش بەو ڕاستیە ناكەن* دڵیان دەردو نەخۆشی وحەسوودی وگومان ناپاكی تێدایە جا خواش

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەردو نەخۆشیەکانی زیادکردن جگەلەوەش سزایەکی سەخت وئێش پێگەیەنەریان بۆ هەیە لەبەر ئەوە کە درۆیان کرد ❊ وە کاتێ پێیان بگوترێ: گێرەشێوێنی وئاشووب وخراپەکاری لەم ولاّت وزەویەدا مەکەن دەڵێن: هەرگیز ئێمە گێرە شێوێن وئاژاوەچی نین، بەڵکو ئێمە هەرچاکسازو ڕێکخەری کاری چاك وباش بووینە ❊ وشیاربن! کەبەڕاستی هەرئەوانن موفسیدوخراپەکارو گێرەشێوێن بەلاّم بەهۆی لووت بەرزیانەوە بەخۆیان نازانن وهەستیش ناکەن کەئەنجامی ئەو درۆیانە هەر دەرئەکەوێ❊ وە کاتێ پێیان بگوترێ: دەسا ئێوەش وەکو ئەو مەردمە ئیماندارە، ئیمان وباوەڕێکی ڕاستەقینە بێنن دەڵێن: جا ئایا ئێمەش وەك ئەو خەڵکە گێل ونەفامانە بڕوابێنین، خەڵکینە چاك بزانن ! کە ئەوانن گێل ونەفامی ڕاستەقینە بەلاّم بەخۆیان نازانن❊ ئەو دوڕووانە کاتێ تووشی ئەوانە ئەبن کەباوەڕیان هێناوە، بۆ فریودانی ئیمانداران ئەڵێن: ئێمەش وەك ئێوە باوەڕمان هێناوەو موسڵمانین!! وە کاتێکیش دەگەنە لای فەرماندە شەیاتینەکانیان دەڵێن: لە

ڕاستیدا ئێمە لەگەڵ بەرنامەو بیروباوەڕی ئێوەداین وە ئێمە هەر گاڵتەیان پێدەکەین* با ئەوانە هەر قسەبکەن، بەڕاستی خوای بالادەست گاڵتەبەوان دەکات ویەك دوو ڕۆژێ مۆڵەتیان دەدات تا پتر خۆیان بەدبەخت بکەن ولەسەرکێشی ولاڕێی خۆیاندا سەرگەردان بن.

وە هەروەها گومان کردن لەوەی خوا دایبەزاندووە، هەرچەندە بەڕووکەش وا پیشانی خەڵکی بدات کە بڕوادارە، خوای گەورە دەفەرموێت﴿إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَارْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ﴾{التوبة: ٤٥}واتە: هەمیشە هەر ئەوانە دارای مۆڵەتت لێدەکەن-نەچنە جیهاد- کەبڕوایان بەخواوبەڕۆژی دوایی نیە ولەڕاستی دینی ئیسلامیش دوودڵن وبەردەوامیش لەدوودڵی خۆیاندا سەرگەردانن ودەتلێنەوە.

وە هەروەها پێناخۆش بوونی حوکمی خواوپێغەمبەرەکەی(صلی الله علیه وسلم)، بۆیە دەفەرموێت﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ

يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلالاً بَعِيداً (٦٠) وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُوداً﴾ {النساء:٦٠-٦١}واتە: ئەرێ ئەوانەت نەدیوە وا دەڵێن باوەڕیان هەیە بەو بەرنامەو قورئانەیە دابەزێنراوە بۆت و بەو پەیامەش پێش تۆ دابەزێنراوە باوەڕدەکەن دەیانەوێ بۆ بڕینەوەی داواوکێشەکانیان بچنە لای تاغووت وبەرنامە شەیتانیەکان؟! لەکاتێکدا فەرمانیان پێدرابوو بەو بەرنامە شەیتانیانە باوەڕنەکەن وکارنەکەن وشەیتانیش دەیەوێ گومڕایان بکات بەگومڕاکردنێکی یەکجار دوورو بێ سنوور* کاتێکیش بەو دوورووانە بگوترێ: وەرنە لای ئەم بەرنامەو شەریعەتە خوا داییەزاندووە، وەرنە لای ئەم پەیامبەری خوایە تا کێشەکەتان بۆ ببڕێتەوە، کەچی دوورووەکان دەبینی بەتوندی ڕووت لێ وەردەگێڕن وقەتیش بەو بەرنامەو بڕیارەی تۆ ڕازی نابن!

وە هەروەها پێناخۆشبوونی سەركەوتن ودەركەوتنی ئیسلام وموسڵمانان ودڵخۆشبوون بە زەلیل بوون وسەرشۆڕبوونیان، خوای گەورە دەفەرموێت﴿إِنْ تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِنْ تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا قَدْ أَخَذْنَا أَمْرَنَا مِنْ قَبْلُ وَيَتَوَلَّوا وَهُمْ فَرِحُونَ﴾{التوبة: ٥٠}واتە: ئەگەر چاكەیەكت دەسكەوت واتە: لەجەنگێكدا سەركەوتن -وەكو فەتحی ولاتی ڕۆم- گەلێ بێتاقەت دەبن وپێیان ناخۆشە، خۆ ئەگەر بەلایەكت تووش ببێ وتێكبشكێن ئەڵێن: ئێمە هەر بەرلەمە ئیحتیاتی خۆمانمان وەرگرت وباشبوو نەچووینە غەزاكە، هەتا ئێمەش تووشی ئەم تێكشكانە ببین وبەدڵشادی وخۆشحاڵیەوە پشت لە پێغەمبەر دەكەن(صلى الله عليه وسلم) ودەچن بەڕێی خۆیاندا. وە یاخود لەئایەتێكی تردا دەفەرموێت﴿هَاأَنْتُمْ أُولَاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَابِ كُلِّهِ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا عَضُّوا عَلَيْكُمُ الْأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ قُلْ مُوتُوا بِغَيْظِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (١١٩) إِنْ تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِنْ

تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا بِهَا وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئاً إِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾{آل عمران:١١٩-١٢٠}.

واته: ئاگاداربن ئەی كۆمەڵی بـاوەڕداران! ئێـوه دوڕووەكانتـان خۆشدەوێت كەچی ئەوان قـەت ئێوەیـان خـۆش ناوێـت، ئێـوه باوەڕتان بەكتێبەكەی خۆتـان وبەكتێبەكـەی ئـەوانیش هەیـە كاتێكیش پێتان بگـەن بـەدوڕوویی وناپـاكی خۆیـان دەڵـێن: باوەڕمـان هێناوە كەتەنیا دەكەون ولێتان دووردەكەونەوە لەبـەر ڕقی خۆیان سەرپەنجەیان دەگەزن واته زۆر ڕقیان لێتانـە، ئـەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بڵێ: دەك بەو دەردوڕقەتانـەوە بـمرن چونكه هەر نیعمەتی خۆی تەواو دەكات بۆ موسـڵمانان بەڕاستی خوا بەو نهێنیـەی نـاو دڵیـان زۆرزانایـەو ئـەزانێ چ پیلانێك بەرانبەر بەموسڵمانان لەسنگیاندایە* ئەگەر چاكەر خێروسەركەوتنێك تووش بیێ پێـی نارەحـەت دەبـن وخەفـەت ومەراقی زۆری پێدەخۆن خۆئەگـەر نارەحـەتی وناخۆشـیەكتان تووش بیێ ئەوان پێی كەیف خـۆش دەبـن، ئەگـەر ئێـوه ئـەی موسڵمانان! لەبەرانبەر هەر نارەحەتیەك بێتە ڕێتان بەئارام بن

هەروەها خۆشویستنی دوژمنانی ئیسلام وسەرانی کوفروبێباوەڕی و بەباشەباسکردنیان وبلاوکردنەوەی بۆچوون وباوەڕی دژبە ئیسلامیان، خوای پەروەردگار دەفەرموێت﴿أَلَمْ تَرَى إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْماً غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مَا هُمْ مِنْكُمْ وَلا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾{المجادلة:١٤}واتە: ئایا سەیری ئەوانەت نەکرد دۆستایەتی نەتەوەیەکیان کرد کەخوا غەزەبی لێگرتوون، ئەو دووڕووانە نەلەئێوەن نەلەوانیشن، بەڵکو خەڵکێکی بێبارن وقسەی ئێوە دەبەن بۆ ئەوان سوێندیش لەسەر درۆ دەخۆن خۆیشیان ئەزانن درۆزنن.

هەروەها تانەدان لەموسڵمانان و بەکەم سەیرکردنی عیبادەتیان، خوای گەورە دەفەرموێت﴿الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لا يَجِدُونَ إِلاَّ جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ اللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾{التوبة:٧٩}واتە: ئەو دووڕووانەش تەوس وڕەخنە لەو موسڵمانانە دەگرن کەبەدڵ وگیان سەدەقەتەکەن، وەتەوس لەوانەش دەگرن کەهەر ئەوە لەتوانایاندا هەیە، بەدەر لەتانەوە

تەشەرەکەیان گاڵتەشیان پێ ئەکەن جا لەبەرانبەر ئەوە خوایش مەسخەرە بەوان دەکات وسزایەکی بەئێشیشیان بۆ هەیە.

ئەوان ڕەخنەو تەشەریان لەموسڵمانە کۆششکاروبەخشەرەکان دەدا بەوەی کەبۆ ڕیـیا دەیکەن وە تانەشیان لەوانە دەدا کەتواناییان کەمە بە کەموکورتی وکەم تەرخەم.

وە هەروەها بەکەم سەیرکردن وسووك بینینی دوعاوپاڕانەوەی موسڵمانان، وەکو دەفەرموێ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُمْ مُسْتَكْبِرُونَ﴾{المنافقون:٥}واتە: کاتێ پێیان بگوترێ: وەرن بۆلای پێغەمبەری خوا تا داوای لێبوردنتان بۆ بکات سەریان بائەدەن وگاڵتەیان لێدێ! ودەیانبینی پشت هەڵ ئەکەن -لەبەر کیبریان- خۆشیان بەگەورە ئەزانن بێنە لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم).

هەروەها تەمەڵی ولەش قورسی لەنوێژدا، وەکو دەفەرموێ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَى يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا

قَلِيلاً﴾{النساء:١٤٢}واتە: بێگومـان دوڕووە دەغەڵەکان بەخـەیاڵی خاویان دەیانەوێ فێـڵ لـەخوا بکـەن وبیخەڵـەتێنن! ئـەو بـڕە ملکەچـی وبەرفەرمانەشـیان هــەربۆ ئەوەیــە، بــەلام خــوا خەڵەتێنەرو تەفرەدەری ئەوانــە، فڕوفێڵەکـەیان زۆر بەئاسـانی پووچەڵ ئەکاتەوە وسەرناگرن هەرکـە دەچـن بـۆ نوێـژکردنیش دەبینـی بەتــەوەزەلی ڕاسـت دەبنـەوە وهەڵدەسـتن، لەبەرانبـەر خەڵکەدا ڕوپامایی دەکەن وبۆ ڕووبینـی نوێژدەکـەن تـا پێیـان نەڵێن کافرن زۆر کەمیشیان یادی خوا دەکەن.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفـەرموێت: " أثقل الصلاة على المنافقين صلاة العشاء والــصلاة الفجــر" واتــە: قورسترین نوێژ لەسەر دوڕووەکان نوێژی عیشاو بەیانیە.

وەهەروەها یەکێکی تر لە نیشانەکانی تری دوڕوویی بریتیە لە ئازاردانی خواوپێغەمبەر و بڕواداران، وەکو دەفەرموێت﴿وَمِنْهُمُ الَّذِينَ يُؤْذُونَ النَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَكُمْ يُـؤْمِنُ بِاللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِلَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾{التوبة:٦١}واتە: لـەناو دوڕووەکانـدا

خەڵكی وا هەیە بەقسەی نابەجێ پێغەمبەر(صـلی الله علیـه وسلم) ئازاردەدات وەبە پێغەمبەر دەڵـێن: خـۆش بـاوەڕو گـوێ لەمشتە واتە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرێ، بڵێ تەنها گوێ لەچاكەیەك دەگرێ قازانجی ئێوە بێت گوێ هەربۆ قسەی ڕاسـت و خێردەگرێ، باوەڕی كامڵی بەخوا هەیـە وهەرچـی بفـەرموێ پیـادەی دەكـات وبەموسـڵمانەكانیش باوەڕدەكـات وبـەزەیی ومیهرەبانیشە بۆ ئەوانەتان بڕوایـان هێنـاوە چـونكە ڕێنمـایی خێریان دەكـات، ئەوانـەش كـە پێغەمبـەری خـوا ئـازاردەدەن سزایەكی ئێش پێگەیەنەریان بۆ هەیە.

وە یاخود لەئایەتێكی تـردا دەفـەرموێت﴿إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمْ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَاباً مُهِينـاً (٥٧) وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَاناً وَإِثْماً مُبِيناً﴾[الاحزاب:٥٧-٥٨]واتـە: بەڕاسـتی ئـەو كەسـانەی ئازاروئەزیـەتی خواوپێغەمبەرەكـەی دەدن واتـە: سەرپێچی لە فەرمانەكانیان دەكەن، خوا لەدونیاو لەقیامەتدا نەفرینی لێكردوون ولەمیهرەبانی خۆی دووری خستوونەتەوە و

سزایەکی زۆر سوککەری بۆ ئامادەکردوون، وە ئەوانەش کە ئازاری پیاوانی ئیمانداروژنانی بڕوادار دەدەن بێ هیچ تاوانێک کردبێتیان بێگومان ئەوانە دڕۆو بوهتان گوناحی ئاشکرایان هەڵگرتووە.

**خوێنەری خۆشەویست:** ئەمانەی کە ڕابوردو باسکران کۆمەڵێک لەنیشانەکانی دوڕوویی بوو کە ئاماژەمان پێکرد، بۆ ئەوەی لێیان وریابین ودەروونی خۆمانی لێ پاکژ بکەینەوە.

اللهم أَعِذنا من النفاق، وارزقنا تحقيق الإيمان على الوجه الذي يرضيك عنا، واغفرلنا ولوالدينا ولجميع المسليمين يارب العالمين، وصلى الله وسلم على نبينا محمد وآلهِ وصحبهِ أجمعين.



## باسی سێ یەم

# لە جۆرەکانــی تری هۆکاری چوونە دۆزەخ

ئەو هۆکارانەی کە خاوەنەکەی پێی فاسق دەبێت ( موسلمانە چونکە باوەڕی هەیە بەڵام فاسقە لەبەر ئەوەی تاوانێکی گەورەی کردووە ) شایەنی چوونە ناو دۆزەخ دەبێت بەڵام بەهەتا هەتایی نا .

سوپاس وستایش بۆ ئەو خوایەی کە هەموو دروستکراوەکانی بەهێزو دەسەڵاتی بەدی هێناوەو ئەفراندووە، وە حیکمەت وکاردروست خۆیشی تێیاندا دەرخستووەو پیشانی داوە، وە تەواوی دروستکراوەکانی بەڵگەو نیشانەن لەسەر تاکێتی ویەکخوایی پەروەردگار، شوکرو سوپاسی دەکەم لەسەر ئەوەی پارمەتی چاکەکاران دەدات بۆ زیاتر چاکەکردن ودەستیشی والآکردوە بۆ تۆبەکاران وسەرپێچیکاران بۆئەوەی لێیان خۆش بێت وبیانبوورێت. وە درودوسەلامیش لەسەر کۆتا پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەو رێنامیی کردووین ورێگەی راستی پیشان داوین، وەلەسەر هاوەڵان رشوێنکەوتە چاکەکانی تا رۆژی دوایی.

خوێنەرانی چاکەخواز: لەباسی یەکەمدا هەندێك لەو هۆکارانە باسکران کە دەبێتە هۆی چوونە دۆزەخ وبەهەتاهەتایی مانەوە تێیدا، وە ئێستا بە پشتیوانی خوای میهرەبان دێینە سەر باسکردنی چەند هۆکارێکی تر کە خاوەنەکە یاخود بکەرەکەی شایستەی چوونە دۆزەخ دەکات بەڵام بەبێ مانەوەی هەتاهەتایی تێیدا.

*** هۆکای یەکەم: ئازاردانی دایك وباوك:**

ئازاردانیش ئەوەیە ئەو پەیوەندیە خۆشەویستیەی کە دەبێت بەجێ بهێنرێت دەبڕدرێت وناگەیەنرێت، یان خراپ هەڵسوکەوت کردن بەرانبەریان بە ووتە یان کردار، خوای گەورە دەفەرمویت﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاهُمَا فَلا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيماً (٢٣) وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنْ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً﴾{الإسراء: ٢٣-٢٤}واته: پەروەردگارت بڕیاری داوەو وەسیەتی کرد کە: دەبێ هەرخۆی بپەرستن، فەرمانیدا کە: دەبێ لەگەڵ دایك وباوکدا چاکەبکەن، جا هەرکات یەکێکیان یان هەردووکیان تووشی پیری ولاوازی بوون هەرگیز نەکەیت وشەیەکی بێزاریان پێ بڵێیت تەنانەت بەرانبەریشیان ئۆفیش مەکە و هەرگیز پێیانا هەڵمەشاخێ و بەسەریاندا مەنەڕێنەو هەمیشەش بە ووشەی ئەدەب و ڕێزی جوان قسەیان لەگەڵ بکە بە باڵی ڕەحمەت ومیهرەبانیان بۆ بێننە خوارێ وبەرانبەریشیان هەمیشە خۆت

کەم وبچوك بگرە ونزا بکەو بلێ: پەروەردگاری من! هەروەکو ئەوان بەشلکی وبەبچوکی لەلەداری منیان کردو ڕەحمیان پێکردم دەسا تۆش لەم پیری وکەنەفت بوونەیاندا ڕەحمیان پێ بکەو میهرەبانبە لەگەڵیان.

وە هەروەها دەفەرموێت﴿أَنْ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْك إِلَي الْمَصِيرُ﴾{لقمان:١٤}واتە: ئەی مرۆڤ بەردەوام سوپاسی من بکە لەسەر نیعمەتەکانم وسوپاسی باوك ودایکیشت بکە لەسەر ئەو هەموو ئەزیەت وئازارە لەپێناوی تۆدا چەشتوویانە، وە گەڕانەوەشتان هەر بۆ لای منە دوای زیندوو بوونەوە.

وە پێغەمبەری ئازیز(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: "ثلاثةٌ قد حرَّمَ الله عليهم الجنَّةَ مدمِنُ الخمرِ والعاقُّ لوالديهِ والدَّيُوثُ الَّذِي يُقِرُّ الْخَبثَ في أهلِهِ"(رواه أحمدُ والنسائي)واتە: سێ تاقم هەن خوا بەهەشتی لەسەریان حەرام کردووە ئەوانیش: کەسێك کە خوری گرتووە بەمەی خواردنەوەوە، وە کەسێك ئازاری دایك وباوکی بدات، کەسێکی ناکەس بەچە(گەواد) کە ڕازیە بەخراپەو داوێن پیسی ماڵ وخێزانی.

### * هۆكاری دووەم: بـڕینی سیلەی ڕەحم:

ئەوەش بریتیە لەوەی كەكەسـێك پەیوەنـدی بپـچڕێت لەگـەڵ خزمانیدا لەو مافەی كەهەیانە لە گیانی ومالّی، لە جوبەیری كـوڕی موتعیمـەوە( ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە، كـە پێغەمبەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) دەفـەرموێت "لا یدخلُ الجنَّة قاطِعٌ" واتە: ئەو كەسـەی سـیلەی ڕەحـم وبـەزەیی ببڕێت ناچێتە بەهەشتەوە.

ئەبوهورەیرە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفـەرموێت" إنَّ الرَّحِمَ قامتْ فقالت لله عزَّ وجلَّ: هذا مقـامُ العائِذ بكَ من القطیعةِ قال: نَعَمْ أما ترضَـینَ أن أصِـلَ مَـن وَصَلَكِ، وأقطعَ مَنْ قطعكِ؟ قالت :بَلَى، قال: فـذِلكَ لـكِ" پاشان پێغەمبەری خوا فەرمووی: گەر ویستتان ئـەم ئایەتـە بخوێننـەوە ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْـسِدُوا فِـي الأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ (٢٢) أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمْ اللَّـهُ فَأَصَـمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ﴾{محمد:٢٢-٢٣}واتە: جا ئەگەر ئێوە لەفەرمانی خوا لاری بكەن وگوێ بەجیهاد نەدەن ئایا سەرەنجامی هەر ئەوە

ببێـت كـە فەسـادوگێرە شـێوێنی وخـوێن ڕشـتن لەزەویـدا بەرپابكەن؟ وهەرچی پەیوەندی خزمایەتی هەیە بیبڕن وبەجێی نەهێنن! ئائەوانـە كەسـانێكن كـە خـوا نـەفرینی لێكـردوون ولەڕەحمـەتی خـۆی بێبەشـی كـردوون ئینجـا كـەڕی كـردوون وكوێرایی هێناوە بەسەرچاویاندا.

بەداخەوە ئەمڕۆ زۆرێك لە موسڵمانان بێناگان لـە هەسـتان بە ئەرك ومافی دایك وباوك وخزمـان و پـەتی ڕەحـم وبـەزەییان لەگـەڵ خزمانـدا بڕیـوە، وە بیـانوی هەنـدێكیان ئەوەیـە كـە خزمانی سەردانی ناكەن بۆیە ئەمیش سەردان ناكات، وە ئـەم بیانووە سوودی نیەو وەرناگیرێت چونكە ئەگەر سەردان نـەكات هەتا سەردان نەكرێت ئەوا سەردانەكە بـۆ خـوا نیـەو بـەڵكو وەكو قەرزدانەوەیەكەو بەرانبەركێیە، عەبدوڵای كوڕی عـەمری كوڕی عاص (ڕەزای خوایان لێبێت) دەگێرێتەوە، كە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت" لیسَ الوَاصِـلُ بالمُكَافـأ ولكنَّ الواصل الَّذِي إذا قُطِعتْ رحِمُه وَصَلَها".

واتە: سەردانكردنى خزمان وپەيوەندى خزمايەتى ئەوە نيە كە بەرانبـەركىٚ بێـت، بـەڵكو گەيەنـەرى پەيوەنـدى خزمايـەتى ئەوەيە كە ئەگەر ئەو پچڕاندى تۆ سەردان بكەى.

وە ئەبو هورەيرە دەڵێت: "أنَّ رجلاً قال يـا رسـول الله إنّ لي قرابةً أَصِلُهم ويَقطَعونني وأحسِنُ إليهم ويسيئون إليّ، وأحلـم عليهم ويَجْهَلون عليَّ، فقال النبي صلى الله عليه وسـلّم: «إن كنتَ كما قُلتَ فكأنما تُسفُّهُم الملَّ، ولا يزالُ مَعَـكَ مـن الله ظهيرٌ عليهم ما دمتَ على ذلك" (رواه مسلم).

واتە: پياوێك ووتى ئـەى پێغەمبـەرى خـوا خزمـانێكم هەيـە سەريان لىٚ دەدەم ئەوان سەرم لىٚ نادەن، چاكەكارم بۆيان ئەوان خراپەكارن بەرانبەرم، سەبرو خۆڕاگرم لەسـەريان بـەڵام ئـەوان نەفامى بەكاردێنن بەسەرما، پێغەمبەريش فەرمووى: ئەگـەر بەو شێوەيە بووى كە ووتت ئەوا وەكو ئەوە وايە تۆ خۆڵەمێشى گەرم بكەيت بەدەميياندا.

يان( بەهەميشەيى پشتگيرو پـشتيوانى خواييـت لەگەڵدايـە بەسەرياندا تا بەو شێوەيە بيت).

*** هۆکاری سێیەم: خواردنی ڕیبا:**

خوای گەورە دەفەرموێت﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَأْكُلُوا الرِّبَا أَضْعَافاً مُضَاعَفَةً وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (١٣٠) وَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ (١٣١) وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾{آل عمران ١٣٠-١٣٢}واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! سوو، چین لەسەر چین مەخۆن و وەری مەگرن وەك سەردەمی نەفامی، دەسا لە خوا بترسن ولەنافەرمانی خۆتان بپارێزن بەشکو بەختیار بن وببیبەنەوە، وەلەو ئاگرەی بۆ بێباوەڕان ئامادەکراوە خۆتان بپارێزن، گوێڕایەڵی خواوپێغەمبەر بکەن، بەتایبەت لە سوو خۆتان بپارێزن بەڵکو بەر ڕەحمەتی خوا بکەون.

وە خوای گەورە هەڕەشەی سەخت دەکات لەو کەسانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ ڕیبا خواردن لەپاش ئەوەی ئامۆژگاری و ئاگاداری خوای پێگەیشت لەسەر خراپی وحەرامێتی ریبا، هەڕەشەی ئاگری لێ دەکات و دەفەرموێت﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لا يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ

قَالُوا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَنْ جَاءَهُ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّهِ فَانتَهَى فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾{البقرة:٢٧٥}واتـە: ئـەو كەسـانەی كە سوو دەخۆن كەلە گۆڕدەنرێن وپاشـان زینـدوو ئەكرێنـەوەو ڕاست دەبنەوە وا ڕاست ئەبنەوە هەر دەڵێی شـەیاتینی دەسـتی لێ وەشاندون، چونكە لـە دونیـادا دەیـانگوت: مامەڵـەوكڕین وفرۆشـتنیش هـەروەكو مامەڵـەكردن بـە سـوو وایـە واتـە هەردووكیان بەلای ئەوانەوە یەكسانن چونكە ئەوان باوەڕیان بە حەرام وحەلاڵ نیە، خوایش كڕین وفرۆشتنی ڕێپیێداوەو سوویشی حەرامكردووە ئینجا هەركەسێك ئامۆژگاری پـەروەردگاری بـۆ هات وبەگوێیشی كردو وازی لە سوو خواردن هێنا ئیتر ئێـستا لە سووێك كەلەبەرا خواردوویەتی چاوپۆشـی ئـەكرێ چـونكە ئەوە پێش حەرامبوونی بووە لەمـەودوایش حەواڵـەی لای خـوا دەكرێ ئەویش بۆی هەیە لێی خۆش بێـت، هەركەسـیش پـاش ئەم بڕیارە گەڕایەوە بۆ سوو خواردن دەبنە یـارو هـاوڕێی ئـاگر وبەهەتاهەتاییش تێیدا ئەمێننەوە چونكە ڕیبایان بەحەلاڵ زانیوەو بەوەش كافربوون.

*** هۆكـاری چـوارەم: خـواردنی مـاڵی هـەتیوان ویـاری پێكردنی :**

خوای گەورە دەفەرمویت﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْماً إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَاراً وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيراً﴾{النساء: ١٠}واتـە: ئەو كەسانەی كەبە ستەم وناهـەق مـاڵ وسـامانی منـداڵانی هەتیوو بێ باوك دەخۆن بێگومان تەنها ئـاگر دەكەنـە سـك و رگیانەوە وبەزوویش دەخرێنە ناو ئاگرێكی زۆر گـەرم وبـەگڕی دۆزەخەوە.

وە هەتیویش ئەوەیە كە پێش ئەوەی باڵغ بێت باوكی بـمرێت.

*** هۆكاری پێنجەم: شایەتیدانی درۆ:**

لە عبدالله ی كوڕی عومەرەوە گێڕڕاوەتـەوە كـە پێغەمبـەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفـەرمویت" لَنْ تزولَ قدمُ شاهد الزورِ حَتَّى يُوجب الله له النـــار"(*) واتـە: لـە ڕۆژی دواییـدا

(*) رواه ابن ماجه والحاكم وقال: صحيح الإسناد. هذا تساهل من الحاكم رحمه الله والصواب أنه ضعيف الإسناد جداً، لكن روى الإمام أحمد ما يؤيده بسند رواته ثقات غير أن تابعيه لم يسم.

دووپێی ئەو کەسەی کە شاهێدی درۆی داوە ناجوڵێ هەتا خـوا ئاگری لەسەر واجب دەکا(دەیخاتە ناو ئاگرەوە).

وە شاهێدی دانی درۆیش ئەوەیە کەسێك شایەتی لەسەر شتێك بـدات کـەنازانێت یـان پێـچەوانەی ڕاسـتی شـایەتی دەدات، چونکە شایەتی دروست نیـە هـەتا بەتـەواوەتی نـەزانێت کـە ڕاستە، چونکە لە فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەر(صـلی الله علیە وسلم) بە پیاوێکی وت: ئایا خۆر دەبینی؟ ئەویش ووتی: بەڵێ، پاشان ووتی: بەو شێوەیە کە دڵنیابوویـت شـایەتی بـدە ئەگەرنا وازبێنەو شایەتی مەدە.

## * هۆکاری شەشەم: خواردنی بەرتیل:

لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە(ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێـت: پێغەمبـەر(صـلی الله علیـە وسـلم) دەفـەرموێت"الراشِـي والمرتشِي في النّار" (رواه الطبراني ورُوَاتُهُ ثقـات معروفـونَ)واتـە: ئـەو کەسـەی کەبـەرتیل دەدات وئەوەیـشی کـە وەری دەگرێـت لەئاگردان.

بەرتیل دەر ئەو کەسەیە کە بەرتیل دەدات بـۆ هاوکـاریکردن وکارئاسانی لەسەر ناهەقی، بەڵام ئەو کەسەی کە دەیـدات بـۆ گەیشتن بەهەق یان لادانی ستەم ودەست درێژیەك ئەوا ناچـێتە ژێر ئەم هەڕەشەیەوە.

*** هۆکاری حەوتـەم: سوێندخواردن بە درۆوە:**

حارسی کوڕی مالك دەڵێت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فـەرمووی " مَنَ اقتطعَ مالَ أخيِه بيمين فاجرةٍ فلْيَتَبَوَّأ مقعدَه من النارِ لِيُبَلِّغ شاهِدُكمْ غائَبكم (مرتَّين أو ثلاثاً)"

(رواه أحمدُ والحاكمُ وصحَّحَه)

واتە : هەر کەسێ سامانی بـرا موسـڵمانەکەی بـە هۆکـاری سوێندنی درۆ ببیبات با شوێنی خۆی لە ئاگردا دیـاری بکـات، بـا ئەوانـەتان کـە ئامـادەن ئەوانـەتان ئاگاداربکاتـەوە کـە ئامادەنین. سێ جار ئەمەی فەرموو.

*** هۆكاری هەشتەم: بڕیاردان و حوكم دان لە نێوان خەڵكیدا بەبێ زانست وزانین یان بەستەم وهەواوئارەزوو:**

لەبەر فەرموودەكەی بورەیدەی كوڕی حصیب( ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت" القضاةُ ثلاثةٌ: واحدٌ في الجَنَّة واثنان في النارِ، فأمَّا الَّذِي فِي الجنةِ فرجل عَرَفَ الحقَّ وقضَى به. ورجلٌ عرفَ الحقَّ فجارَ في الحكمِ فهو في النارِ. ورجلٌ قضَى للناسِ على جهلٍ فهوَ في النارِ " رواه أبو داود والترمذيُّ وابنُ ماجة .

واتە: قازیەكان سێ جۆرن: یەكێكیان لەبەهەشتدایە و دووانەكەی تر لە دۆزەخ، ئینجا ئەوەی كەلە بەهەشتدایە پیاوێكە حەقی ناسیوەو بڕیاری داوە پێی، وە پیاوێك حەقی ناسیوەو ستەمی كردووە لە حوكمەكەیدا ئەوە لە ئاگردایە، وە پیاوێك قەزاوەت دەكات لە نێوان خەڵكیدا بەنەزانین ئەوەش لەئاگردایە.

*** هۆکاری نۆیەم: غەش وخیانەت کردن لە ژێردەستەو ئامۆژگاری نەکردنیان، بەشێوەیەك هەڵسوکەوت دەکات و مامەڵەیان لەگەڵ دەکات کەلە بەرژەوەندیاندا نیە:**

ئەوەش لەبەر فەرموودەکەی مەعقەلی کوڕی یسار(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت گوێم لە پێغەمبەر بوو(صلی الله علیه وسلم) کە فەرمووی " مَا مِنْ عبدٍ يسترْعِيه الله على رعيةٍ يموتُ يوم يموت وهو غاشٌ لِرَعيَّته إلاَّ حرَّمَ الله عليه الجنَّةَ "(متفق عليه)

واتە: هیچ بەندەیەك نیە کە خوا بیکات بە کاربەدەست بەسەر کەسانێکدا و پاشان ئەو ڕۆژەی کە دەمرێت ئەگەر غەش وخیانەتی کردبێت لە ژێردەستەکانی ئەوا خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات.

وە ئەمەش گشتگیرەو هەموو کاربەدەست وفەرمانڕەوایەك دەگرێتەوە، وەکو باوك کە سەرۆکی خێزانە هەتا بەرزترین پۆست وپلەی فەرمانڕەوایی، لەبەر فەرموودەکەی ئیبن عومەر(ڕەزای خوایان لێبێت) کە دەڵێت گوێم لە پێغەمبەر بوو(صلی الله علیه وسلم) کە فەرمووی "كُلُّكُمْ راعٍ

ومسؤولٌ عن رعيَّته، الإمامُ راعٍ ومسؤولٌ عن رعيَّته، والرجلُ راعٍ في أهلِه ومسؤولٌ عن رعيَّتِه، والمرأةُ راعية في بيت زوجها ومسؤولةٌ عن رعيَّتِهَا، والخادمُ راع في مال سيِّده ومسؤول عن رعيّتِه، وكُلُّكُم راعٍ ومسؤولٌ عن رعيتِه" (متفق عليه).

واته: هەمووتان شوانن وبەرپرسن لە ژێردەستەکانتان، پێشەوا وسەرۆك شوانەو بەرپرسە لە ژێردەستەکەی، پیاو شوانەو بەرپرسە لە ماڵ و خێزان وژێردەستەکەی، وە ژنیش شوانەو بەرپرسە لە ماڵی مێردەکەی وبەرپرسە لە ژێردەستەکەی، وە خزمەتکاریش بەرپرسە لەماڵی گەورەکەی وبەرپرسە لە ژێردەستەکەی، هەمووتان شوانن وبەرپرسن لەژێردەستەکانتان.



*** هۆکاری دەیـەم: وێنەدروسـتکردنی شـتێك کـە گیـان لەبەر بێ یان مرۆڤ وئاژەڵ (وێنەگرتن یان وێنەکێشان یـان پەیکەرو هەڵکۆڵین):**

لە ئیبن عباسەوە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبـەر بـوو(صـلی الله علیه وسلم) کە فـەرمووی " كلُّ مُصوِّرٍ في النارِ يَجْعَلُ له بكلِّ صورةٍ صوَّرَها نَفْساً فتَعَذِّبُه في جهنم"(رواه مسلم) واتـە: هـەموو وێنەگرێك لـە ئاگردایـە، هـەر وێنەیـەکی دروسـت کردبێـت دەیهێنن ورۆحی بەبەردا دەکەن و ئازاری دەدەن لە دۆزەخدا.

لە گێڕانەوەیەکی تردا لای بوخاری بە شێوەیە هـاتووە: " مَـنْ صوَّر صورةً فإن الله مُعذِّبُه حتى ينفخ فيها الروحَ وليس بنـافخٍ فيها أبداً" واتە: هەرکەس وێنەیەك بکات ئـەوا خـوای گـەورە سزای دەدات هەتا کەسەکە ڕۆح بەبەری وێنەکەیـدا دەکـات وە هەرگیزیش ناتوانێت ڕۆحی بەبەردابکات.

بەڵام وێنەی دارودرەخت وڕووەك وئەو شتانەی کە گیـان لەبـەر نین لەسەر ڕای زۆرینەی زانایان هیچی تێدا نیە و دروسـتە إن شاء الله، هەرچەندە هەندێك لەزانایان ڕێگەیان بەوەش نەداوە،

ئەوەش لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە ئـەبوهورەیرە دەیگێڕێتـەوە ودەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر بوو(صلى الله عليـه وسـلم) کـە فەرمووی " قال الله عزَّ وجلَّ : ومَنْ أظلمُ مَّمن ذهـــبَ يخلــقُ كخلقِي فلْيَخْلُقوا ذرَّةً أوْ لِيخلقوا حبةً أو شَــعِيرةً"(رواه مـسلم).

واتە: خوای گەورە فەرموویەتی : کێ لـەوە سـتەمکارترە کـە وێنەی دروستکراوەکانی من دروست دەکـات بـا مێرولەیەکـە بچوک یان دانەوێڵەیەك یان جۆیەك دروست بکەن.



*** هۆكاری یازدەیەم: هەموو سەرسەخت ورەزیل وچروك وخۆ بەگەورەزانێك :**

حارسەی كوڕی وەهب(ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی "ألا أخبركُم بأهل النارِ؟ كلُّ عُتُل جَوَّاظٍ مستكبرٍ" . (صحيح الجامع ٢٥٩٨)

واتە: هەواڵتان بدەمێ سەبارەت بە دۆزەخ نشینان؟ هەموو سەرسەخت ورەزیل وچروك وخۆبەگەورەزانێك.

عتل: سەرسەختێكی توڕە كە نەبۆ حەق ونەبۆ خەڵك نەرم دەبێت.

جواظ: ڕەزیل ودەستگیرۆیەكی وەها كەهەر ماڵ كۆدەكاتەوەو نایبەخشێ.

مستكبر: كەسێكە كە حەق ڕەددەكاتەوەو بۆ حەق وڕاستی ملكەچ نابێت، خۆی لە خەڵك بەرزتر دەزانێت وتەنها بۆچوونی خۆی بەڕاست وپەسەند دەزانێت.

*** هۆكاری دوازدەیەم: بەكارهێنانی قاپ وقاچاغ ودەفری لە ئاڵتون وزیو دروستكراو بۆ پیاوان وئافرەتان:**

ئوم سەلەمە دەڵێت پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی" الذي يشربُ في آنية الفضةِ إنما يجرجرُ في بطنِه نارَ جهنم" وفي رواية " إن الّذي يأكل أو يَشرب في آنيةِ الذهب والفضةِ إنما يجرجرُ في بطنه نارَ جهنمَ".

واتە : ئەو كەسەی لە قاپ و قاچاخی زیودا دەخواتەوە ئەوە لە ئاگری دۆزەخدا بەناو سكیدا دەهێنرێ و دەبرێ.

لە ڕیوایەتێكی تر دا دەفەرموێت : ئەوەی كە لە قاپ و قاچاخی ئاڵتون و زیودا دەخوات و دەخواتەوە ئەوە لە ئاگری دۆزەخدا بەناو سكیدا دەهێنرێ و دەبرێ.

جا براو خوشكانم وریاو بێداری ئەم هۆكارانە بن كەسەر دەكێشن بۆ ئاگر، ئەو هۆكارانە بگرنە بەر كە دوورتان دەخاتەوە لە دۆزەخ بۆ ئەوەی بەختەوەر بین لەهەردوو دونیا، بزانن كە دونیا كورتەو زوو نامێنێت، داوا لە خوا بكەن كە

جێگیرودامەزراومان بكات لەسەر دین هەتا مردن، وە لەگەڵ
بڕواداراندا حەشرو حیسابمان بكات.

اللَّهُمَّ ثبِّتْنَا على الحقِّ وتوفَّنا عليه، واغفر لنا ولوالِدِينا ولجميع
المسلمينَ برحمَتِك يا أرحم الراحمين. وصلَّى الله وسلَّم على نبيِّنا
محمدٍ وعلى آلِهِ وصحبهِ أجمعين.

==========================

## ناوەرۆك


**باسی یەكەم : كورتە باسێك سەبارەت بە وەصفی دۆزەخ.. ٦**

**باسی دووەم : هۆكارەكانی چوونە دۆزەخ.............. ٢١**

*هۆكاری یەكەم : هاوبەش دانان بۆ خوا :.................. ٢٤

* هۆكاری دووەم : بێباوەڕبوون بەخوا یان بەفریشتەیەك............ ٢٥

* هۆكاری سێیەم : دان پێدانەنان لەیەكێك لە پێنج پایەكەی ئیسلام... ٢٧

* هۆكاری چوارەم : گاڵتەكردن وسووكایەتی بەخواو دینەكەی.......... ٢٨

* هۆكاری پێنجەم : جنێودان بەخواو دینەكەی یان پێغەمبەرەكەی........٢٩

* هۆكاری شەشەم : حوكم كردن بەجگەلە قورئان وبەرنامەی خوا..........٣١

* هۆكاری حەوتەم : دوڕوویی .............................. ٣٣

**باسی سێ یەم: لە هۆكاری تری چوونە دۆزەخ............ ٤٧**

* هۆكای یەكەم : ئازاردانی دایك وباوك........................ ٤٨

* هۆكاری دووەم : بڕینی سیلەی ڕەحم.......................... ٥٠

* هۆكاری سێیەم : خواردنی ڕیبا............................٥٣

* هۆكاری چواردم : خواردنی ماڵی هەتیوان ویاری پێكردنی ............٥٥

* هۆكاری پێنجەم : شایەتیدانی درۆ..........................٥٥

* هۆكاری شەشەم : خواردنی بەرتیل..........................٥٦

* هۆكاری حەوتەم : سوێندخواردن بە درۆوە........................٥٧

* هۆكاری هەشتەم : حوكم دان لە نێوان خەڵكیدا بەبێ زانست............ ٥٨

* هۆكاری نۆیەم : غەش وخیانەت كردن لە ژێردەستە..................٥٩

* هۆكاری دەیەم : وێنە دروستكردنی شتێك كە گیان لەبەر بێ............ ٦١

* هۆكاری یازدەیەم : ڕەزیلی وچروكی وخۆ بەگەورەزانین ..........٦٢

* هۆكاری دوازدەیەم : بەكارهێنانی قاپ ودەفری ئاڵتون وزیو ........... ٦٢